بە ناوی خوای گەورە و میهربان

# سەرەتایەك بۆ فێربوونی MySQL




www.h4kurd.com

# پێڕست

# 1- پێناسەی Database

## DATABAS

### بەکورتی

بریتیە لە کۆمەڵێك زانیاری دروست بەیەکەوە بەستراو بەشێوەکەی لۆجیکی ڕێکی دەخەی بە پێی پێویستی بە شێوەکی زانستی ڕێك وپێك هەڵی دەگری لە کاتی پێویست بە کاری دەهێنی بۆ سوود وەرگرتن لە و زانیاریانە بە و شێوەیەکەی کە خۆمان بمانەوێ. مەرج نیە تەنها لە ناو کۆمپیوتەر بی زۆر جار لە ناو مۆبایل کۆمەڵێك زانیاریت هەیە پێکهاتووە لە ناو ژمارە ..هتد دەتوانی بەوەش بڵێن داتا بێز. بەڵام لە ناو کۆمپیوتەر جیاوازە بە شێوەك کە دەتوانی هەموو زانیاری کۆمپانیا یان فەرمانگە بۆ نموونە ناوی فەرمانبەر و ژمارەی فەرمانبەر و موچەی فەرمانبەر و ساڵی خزمەت و.. هتد تێدا کۆبکەیوە بە شێوەك کە گشت زانیاریەکان لە خۆ بگریَ بۆ بەڕێوەبردنی ئەو زانیاریانە کارئاسانیت بۆ دەکات لە کاتی گەڕان زیاد کردن و نوێکردنەوە سڕینەوە پاراستنی و چارەسەرکردنی گشت زانیاریەکان لە ڕێگەی یەکێك لەو بەرنامانەی کە پێدەگوترێ Database Management system

# 2- MySQL چیە ؟؟

پێش ئەوەی پێناسەی MySQL بکەین با ڕونکردنەوەیك بدەین زۆر جار تێکەڵاویەك دروست دەبی لە نێوان Database, Database server , Database language

بێگومان زۆر لێك جیاوازن

### Database

ئەوە لەسەرەوە باسمان کرد کە بریتیە لە داتا و زانیاری هەڵگیراو

### Database server

بریتیە لە کۆمەڵێك پرۆگرام بۆ بەڕێوەبردن وەك (MySQL , PostgreSQL , MS SQL server )

### Database Language

بریتیە لە زمانی پرۆگرامسازی ( SQL ) کە زمانێکی( Non Procedural) تایبەتە بە داتابێز

کردارەکان لە ڕێگەی فرمانەکانی زمانی SQL دەچێتە یەکێك لە سیستەمەکانی بەڕێوەبردنی داتابێز لەوێشەوە جێبەجێ دەکات لە ناو داتابێزەکە.




سوودەکانی و گرنگی **Database**

**هەرچەندە سوودەکانی زۆرترە لەوەی باسی دەکەین بەڵام دیارترینیان**

1- خێرا گەیشتن بە زانیاری
2- ئاسانی لە گەڕان بە دوای زانیاری ویستراو
3- ڕێکخستنی زانیاری بەشێوەیەکی ڕێك و پێك
4- کەمبونەوە لە زانیاری دووبارە
5- کەمبونەوەی زانیاری بێسوود
6- ئاسانە لە ئەنجامدانی گۆڕانکاری
7- پاراستنی زانیاری لە مەترسی ناوچوون
8- ئاسانکاری لە گۆڕانکاری و زیادکردنی و نوێکردنەوەی زانیاری




زانیاری هەڵدەگری و پاشان زیادی دەکەی وە ڕێکی دەخەی دەتوانی بیگەڕێنەوە لە کاتی پێویست وەپارێزروەدەبی

با بزانین خودی **SQL** چیە ؟؟ کورتکراوەی **Structured Query Language**

**( SQL ) بریتیە لە زمانێکی پرۆگرامسازی کە زمانێکی( Non Procedural) تایبەتە بە داتابێز**

بەوەی لە زمانەكانی تر پرۆگرامسازی تر جیادەكرێتەوە كە تایبەت بە داتا بێزە پێكهاتووە لە كۆمەڵێك فرمانی جیاواز بۆ بەڕێوەبردن و چارەسەركردنی داتابێز لە سڕینەوە و زیادكردن و گەڕان و ڕێكخستن كرداری ژمێریاری ......هتد

ئێستا زۆر ئاسان بوو بۆ ئەوە لە پێناسەی MySQL تێبگەی بریتیە لە سیستەمێكی بەڕێوەبردنی داتابێز كە پشت بە فرمانەكانی SQLدەبەستێ بۆ جێبەجی كردنی كردارەكان . كە لە لایەن Michael Widenius داڕێژراوە ناوەكەشی بە ناوی منداڵەكەی كردیە كە ناوی My بووە لە لایەن كۆمپانیای MySQL AB بەرهەم هێندرا ئێستا كۆمپانیای سەن مایكرۆسیستەم خاوەنداری كردیە كە بەشێكە لە ئۆراكل. پرۆگرامێكی سەرچاوەكراوەیە واتا Open source بەڵام وەشانی تایبەتیشی هەیە كە پارە دەیكرێ. بێگومان MySQL لەگەڵ زۆربەی زمانەكانی پرۆگرامسازی دەگونجێ بۆ ئیشكردن كە هەندێ پێانوایە تەنها لەگەڵ PHP ئیشدەكات ئەو بۆچوونە زۆر هەڵەیە چونكە دەتوانی لە گەڵ زمانەكانی Java PHP , Ruby , Python , Perl , C# زۆری تر مامەڵە بكات بەبێ كێشە چونكە زۆربەی زمانەكی پرۆگرامسازی پێك هاتووە لە كۆمەڵێك Function كە تایبەت كراوە بە مامەڵەكردن لەگەڵ MySQL

بەڵام بەشێوەكی گشتی و بەربڵاو لەگەڵ زمانە Open source كان و بەزۆری بۆ بەرنامەكانی وێب بەكاردێ كە چەندین ماڵپەڕی جیهانی بەناوبانگ پشت بەو سیستەمە دەبەستن بۆ بەڕێوەبردنی داتابێز. وەهەروەها ئەو زمانانەی كە زۆر لەگەڵی بەكاردێن بریتیە لە PHP وە Perl و Python ئیشی پێدەكرێ لەسەر سیتەمی ئیشپێكردنی Linux و پرۆگرامی Apache كە ژینگەیەكی زۆر گونجاو لەبار پێكدەهێنن بۆ بەڕێوەبردنی پرۆگرامەكانی وێب كە ناویان ناوە بە LAPM .

L كوتكراوەی linux ە كە سیتەمێكی ئیشپێكردنە

A كورتكراوەی Apache

P كورتكراوەی هەریەك لە زمانەكانی Python , PHP, Perl ە

M كورتكراوەی MySQL ە

لێرەوە كۆتایی بە ڕونكردنەوە و پێناسە دەهێنین دەچینە سەر جێبەجێ كردنی فرمانەكانی SQL لە سەر سیستەمی بەڕێوەبردنی داتابێزی MySQL هەوڵ دەدەین تەنها لە ڕێگەی فرمانەوە ئیش بكەین نەك لە سەر پرۆگرام بۆ ئەوەی ئاشنایی فرمانەكان بی چونكە فرمانەكان 85% لە هەموو سیستەمەكانی بەڕێوەبردنی داتابێز دووبارەدەبنەوە لەگەڵ هەندی زیادكردن كە لە بەرنامەێك بۆ بەرنامەێكی تر دەگۆڕی.

پێش ئەوەی بچینە سەر دابەزاندن و ئیشكردن با ڕونكردوەەك بدەم لە سەر table , column , field

بەكورتی خشتەیەكە پێك هاتووە لە هێڵی ستونی و ئاسۆی كە تێدا زانیاری هەڵدەگیرێ لەو وێنەیە بە جوانی ڕونكرایەتەوە

| Table | | | Column | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | |
| Row | | | | | | | |
| | | | | | | | |
| | | | | | | | |
| | | | | | | | |

## Data Type -3

چۆرەکانی داتا لە سیستەمێك بۆ سیتەمێکی تر دەگۆڕی بەڵام بە شێوەکی گشتی لە تێکست و ژمارە و کات پێك دێ

بۆیە بە کورتی دیان نووسینەوە.

TEXT TYPES تایبەتە بە دەق واتا تێکست

| | |
|---|---|
| CHAR( ) | A fixed section from 0 to 255 characters long. |
| VARCHAR( ) | A variable section from 0 to 255 characters long. |
| TINYTEXT | A string with a maximum length of 255 characters. |
| TEXT | A string with a maximum length of 65535 characters. |
| BLOB | A string with a maximum length of 65535 characters. |
| MEDIUMTEXT | A string with a maximum length of 16777215 characters. |
| MEDIUMBLOB | A string with a maximum length of 16777215 characters. |
| LONGTEXT | A string with a maximum length of 4294967295 characters. |
| LONGBLO | A string with a maximum length of 4294967295 characters. |

---

NUMBER TYPES تایبەتە بە ژمارە

| | |
|---|---|
| TINYINT( ) | -128 to 127 normal 0 to 255 UNSIGNED. |
| SMALLINT( ) | -32768 to 32767 normal 0 to 65535 UNSIGNED. |
| MEDIUMINT( ) | -8388608 to 8388607 normal 0 to 16777215 UNSIGNED. |
| INT( ) | -2147483648 to 2147483647 normal 0 to 4294967295 UNSIGNED. |
| BIGINT( ) | -9223372036854775808 to 9223372036854775807 normal 0 to 18446744073709551615 UNSIGNED. |
| FLOAT | A small number with a floating decimal point. |
| DOUBLE( , ) | A large number with a floating decimal point. |
| DECIMAL( , ) | A DOUBLE stored as a string , allowing for a fixed decimal point. |

---

DATE TYPES تایبەتە بە کات و بەروار

| | |
|---|---|
| DATE | YYYY-MM-DD. |
| DATETIME | YYYY-MM-DD HH:MM:SS. |
| TIMESTAMP | YYYYMMDDHHMMSS. |
| TIME | HH:MM:SS. |

## 4- دابەزاندنی MySQL

MySQL پاڵپشتی دەکرێت لەلایەن سیستەمە جواروجۆرەکانی وەک ( NetBSD , AIX , FreeBSD , HP-UX , Linux , Mac OS , NovellNetware , OpenBSD , OpenSolaris , eComStation , QNX , IRIX , Microsoft Windows ,SunOS , یان OS/2 ( Symbian

لەسەر هەموو سیستەمێک ئیشدەکات وابزانم هیچ سیستەمێك نیە پاڵپشتی نەکات ☺ من ڕونکردنەوەکان و

تاقی کردنەوەکان لەسەر ویندۆز دەکەم تۆش ئارەزووی خۆتە لەسەر چ سیستەمێك ئیش دەکەی ئەوە دابیەزێنە و ئیشی پێبکە بەڵام من لەسەر ویندۆز دایدەنێم لەبەر ئەوەی زۆربەمان لەسەر ویندۆز ڕاهاتوون

بەرنامەی Apache HTTP Server دایدەبەزێنم چونکە , PHP , MySQL , phpmyadmin هەمووی بەیەکە دادەبەزی بۆ ئیشکردن زۆر ئاسانە و بێکێشەیە دواتر دەتوانین سوود لە phpmyadmin وەرگرین و وە هەروەها سوود لە PHP وەرگرین بۆ تاقی کردنەوەی زیاتر و ڕونکردنەوە پێویستە

بەرنامەی تر هەیە هەمان شت دەکات وەک XAMPP و Wamp server..هتد دەتوانی بەکاری بینی.

لە خوارەوە بە وێنە ڕوونی دەکەمەوە چۆن دادەبەزی و چۆن ئیشی پێبکەین

سەرەتا بەرنامەکە دابەزێنە دەتوانی لە سایتی سەرەکی دایبەزێنی پاشان وەک بەرنامەیەکی ئاسای دوو کلیکی لەسەر بکە.



*AppServ 2.6.0 Setup*















ئەوەی گرنگە ئەوەیە ووشەی نهێنی واتا پاسۆردەكەی دەنووسی لە بیری نەكەی دواتر ئیشت پێدەبی









تەواو ئێستا بەرنامەكە بە سەركەوتووی دابەزی ئامادەیە بۆ ئیشپێكرد

بۆكردنەوەی بەرنامەكە برۆ Start پاشان كليك لەسەر فۆڵدەری AppServ بكە پاشان كليك لەسەر MySQL Command line Client بكە داوای پاسۆرد دەكات پاسۆرد بنووسە و Enter بكە




كليك لەسەر
MySQL Command Line Client
بكە

```
Enter password: ****        ← پاسۆرد
Welcome to the MySQL monitor.  Commands end with ; or \g.
Your MySQL connection id is 3
Server version: 6.0.4-alpha-community-log MySQL Community Server
(GPL)

Type 'help;' or '\h' for help. Type '\c' to clear the buffer.

mysql>
```

ئێستا هاتینە سەر مێزی ئیشكردن



پاسۆردەكە هەمان پاسۆردە كە لە كاتی دابەزاندنی بەرنامە نووسیمان كە بریتی بو لە root كە لاپەڕە 9 ئاماژەم پێكردیە

## 5- ناساندنی DDL

بەکورتی DDL کورتکراوەی Data Definition Language زمانی شیکردنەوە و پێناسەکردنی داتاکان کە پێك دێت لە ( ALTER DATABASE,ALTER TABLE,CREATE DATABASE,CREATE INDEX,CREATE TABLE,DROP DATABASE,DROP INDEX,DROP TABLE,RENAME TABLE )

## 6- SHOW DATABASE

یەکەم فرمان بەکار دێت بۆ پیشاندانی داتابێزەکان واتا ئەو داتابێزانەی کە هەیە لەڕێگەی ئەو فرمانەوە پیشانمان دەدات

```
Enter password: ****
Welcome to the MySQL monitor.  Commands end with ; or \g.
Your MySQL connection id is 1
Server version: 6.0.4-alpha-community-log MySQL Community Server (GPL)

Type 'help;' or '\h' for help. Type '\c' to clear the buffer.

mysql> SHOW DATABASES;  ←  لە کۆتایی هەموو فرمانەکان ; دابنێ
+----------------------------+
| Database                   |
+----------------------------+
| information_schema |  ← داتا بێز
| mysql              |  ← داتا بێز
| phpmyadmin         |  ← داتا بێز
| test               |  ← داتا بێز
+----------------------------+
4 rows in set (0.00 sec)     ← ئەنجام واتا 4 داتابێز هەیە

mysql>
```

## 7- CREATE DATABASE

واتا دروستکردنی داتابێز :- بۆ ئەوەی داتا بێز دروستکەین پێویستمان بەو فرمانەی سەرەوە دەبێ بەم شێوەیە بەکار دێ

```
CREATE DATBSE `name database`;
```

ئێستا داتا بێزەکی نوێ دورستبکە لەڕێگەی ئەو فرمانەی سەرەوە بۆ نموونە :

من داتابێزەکم بە ناوەی ( emp ) دروستکرد

```
mysql> CREATE DATABASE `emp`;
Query OK, 1 row affected (0.00 sec)
```

ئێستا بۆ ئەوەی بزانین داتا بێزەکە دورست بووە ئەو فرمانە بەکار بینە بۆ پیشاندانی داتابێزەکان

SHOW DATABASES

بۆ نموونە :

```
mysql> SHOW DATABASES;
+--------------------------+
|         Database         |
+--------------------------+
| information_schema |
|  admin                   |
|  emp                     |
|  link                    |
|  loadmore                |
|  mysql                   |
|  phpmyadmin              |
|  search                  |
|  test                    |
|  world                   |
+--------------------------+
rows in set (0.00 sec 18)
```

ئەو داتا بێزەی کە دروستمان کرد ←

ئێستا وەك لەسەرەوە دیارە کە داتابێزەکە بە سەرکەوتووی دروست بووە دەتوانی چەند داتا بێزت بوێ دروستی بکەی بەبێ کێشە . بەهەر ناوەك کە بتەوێ بەڵام بەمەرجێك ناوەکە دووبارە نەبێ بۆنموونە ئەگەر داتا بێزەکت هەبوو بە ناوەی emp ئەوە ناتوانی بە هەمان ناو داتا بێزێکی تر دروستبکیەوە

وە خاڵێکی تر دەتوانی بە ژمارەش دورستی بکەی واتا لە جیاتی ناو تەنها ژمارە دابنێ بەڵام ئەوە ڕێگەیە زۆر گونجاو نیە بۆ دیزانی داتابێز باشتر وایە ناوێکی گونجاو دابنێ تا بە ئاسان بی لە کاتی گەڕان و دەستکاری کردنی

تێبینی :- لە کاتی دروستکردنی داتا بێز دەبی ناوی داتا بێزەکە لە نێوان دو کود بەو شێوەیە بینوسەوە ` ` لەنێوانیان ناوی داتابێزەکە بنووسە

# DROP DATABASE -8

سڕینەوەی داتا بێز واتا ئەو داتا بێزەی دەتەوێ بیسڕیەوە دەتوانی لەڕێگەی ئەو فرمانە بیسڕیەوە

تێبینی :- سڕینەوەی داتابێز واتا سڕینەوەی هەموو ئەو زانیاریانەی کە تێدایە. وەك ئەوە وایە تۆ فۆڵدەرەك بسڕیەوە ئەو فۆڵدەر کۆمەڵێك فایلی تێدابی بۆیە دەبی ئاگاداربی لەکاتی سڕینەوەی هەر داتابێزەك پێش ئەوەی بیسڕیەوە تەواو بپشکنی و دڵنیابی لە سڕینەوەی چونکە پاش سڕینەوە ناگەڕێتەوە

DROP DATABASE وەك نوسراوە بەم شێوەیە بەکاردێ تەنها ناوی داتابێزەکەی بۆ زیاد دەکەی کە دەتەوێ بیسڕیەوە

```
mysql> DROP DATABASE `emp`;
Query OK, 0 rows affected (0.01 sec)

mysql>
```

بەم شێوەیە توانیمان داتابێزەکە بسڕینەوە

بۆ دڵنیا بوون لە سڕینەوە فرمانی SHOW DATABASES بەکار بینە بزانە سڕایتەوە ؟؟

```
mysql> SHOW DATABASES;

+--------------------------+
|         Database         |
+--------------------------+
| information_schema |
|  admin                   |
|  link                    |
|  loadmore                |
|  mysql                   |
|  phpmyadmin              |
|  search                  |
|  test                    |
|  world                   |
+--------------------------+
rows in set (0.00 sec 18)

mysql>
```

وەك تێبینی دیارە لە لەلیستی داتا بێزەکان داتا بێزی emp نەمایە واتا سڕایتەوە

بەم شێوەیە داتا بێز دورست بکە و پاشان بیسڕوە تا تەواو ڕا دێ لەسەر بەکارهێنانی ئەو فرمانە.

# CREATE TABLE -9

بەشێکی سەرەکی داتابێزە وەك خشتەیەکە لە هێڵی ستونی و ئاسۆی پێك دێ زانیاریەکانی تیدا هەڵدەگیری.

پێش ئەوەی باسی دروستکردنی table پێویستە هەندێ زانیاری گرنگ هەیە دەبێ بیزانی بۆ ئەوەی بتوانی بە ئاسانی table دروستبکەی

،




وەك لە وێنەکە دیارە هەر یەك لە table و Row و Column پێك دێ

Table گرنگترین بەشە وەك خشتە وایە نموونەی فۆڵدەرە بۆ هەڵگرتنی فایل

Row ئەو زانیاریانە تۆ داخلی دەکەی لە یەکێك لە ستونەکان وەهەروەها دەتوانی بە RECORDS ناوی بنێ

Column بریتیە لە ستونێك لە ناو خشتەکە کە هەر ستونێك هەندێ زانیاری لە خۆ دەگری .

ئێستا ئەگەر بمانەوێ table دروستبکەین دەبی یەکەم جار داتابێزێك دروستکەین و پاشان داتابێزەکە دیاری بکەین بۆ ئەوە table تێدا دروست بکەین پێشتر باسی چۆنیەتی دروستکردنی داتابێزمان کرد پێویست ناکات دووبارەبکەینەوە ئێستا تۆ داتابێزەك دروست بکە . بۆ نموونە داتابێزەك دروست بکە بەناوی

Kurdistan پاشان داتابێزەکە دەستنیشان کە لە ڕێگەی فرمانی use

```
mysql> CREATE DATABASE `kurdistan`;  ← ئەو داتابێزەی دورستمان کرد
Query OK, 1 row affected (0.00 sec)

mysql> USE kurdistan;  ← دیاری کردنی داتا بێز

Database changed ← واتا داتابێزی دیاری کراو ئامادە بۆ ئیشکردن لەسەری
```

پێش هەموو شتێك بۆ ئەوەی table دروستبکەی دەبی پێشوەخت ئەوتو بزانی ئەو table دروستدەکەی لە چەند Field پێدێ وەك ئەو نموونەی خوارەوە دیارە

| | Field | Type | Collation | Attributes | Null | Default | Extra |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ☐ | id | int(11) | | | No | | auto_increment |
| ☐ | name | varchar(200) | utf8_general_ci | | No | | |

من 2 Field داناوە واتا داتابێزەکە بە ناوی کوردستان کە دروستمان کرد وە تەیبڵەك بەناوی City دروست کرد دوای ژمارەی City پاشان ناوی City

بۆ زیاتر ڕونکردنەوە :-

داتابێزەك بە ناوی کوردستان دوای تەیبڵەك بەناوی شار دوای ژمارەی ڕیزبەندی و ناوی شارەکان .

فرمانەکە بەو شێوەیە دەنوسری

```
CREATE TABLE `city` (
`id` INT NOT NULL AUTO_INCREMENT PRIMARY KEY ,
`name` VARCHAR( 25 ) NOT NULL);
```

سەرەتا فرمانەکە بنووسەو CREATE TABLE

ناوی تەیبڵەکە city وەك دیارە لە نێوان دوو ` ` بنووسیەوە لە لاپەڕە 13 باسم کرد کەوانەك بکەوە

پاشان id دەنووسی وەك ڕیزبەندی وایە واتا ژمارە ئەویش بە هەمان شێوە لە نێوان دوو کۆد بنووسەوە

INT واتا ژمارەیی کورت کراوەی INTEGER واتا ژمارەی ڕاست لە لاپەڕە 6 باسم کردیە

NOT NULL واتا خاڵی نیە چونکە ژمارەیکی تێدا دەنوسری 1و2و3و4 وەهەروەها

AUTO_INCREMENT واتا دانانی ژمارە بە اتوماتیك نەك بەدەستی ژمارەکان بنوسینەوە لە دوای بە درێژی باسی دەکەین

PRIMARY KEY واتا کلیلی دروست و دوبارە نەبوەوە واتا دوو ژمارەی وەك یەك وەرناگری ئەوەش لە دوای بە درێژی باسی دەکەین

Name واتا ناوی شارەکان ئەویش بە هام شێوە دەبی لە نێوان دوو کۆد بنوسی

VARCHAR ئازادی لە دانانی تێکست و ژمارە لە 0 وە تا 255 . لە لاپەڕە 6 باسم کردیە و دواتر بە درێژی باسی دەکەین

( 25 ) لێرە دیاری دەکەی کە درێژی تێکستەکە لە چەند پیت پێك هاتووە وەك گوتم دەتوانی لە نێوان 0 تا 255 دابنێ

NOT NULL باسمان کرد لە سەرەوە دوای کەوانەکە دابخە و لە کۆتایی ; دابنێ و ئینتەر بکە

تێبینی :- وا باشترە و جوانترە تەنها فرمانەکانی SQL بە پیتی گەورە بنووسیەوە.

ئێستا دەبێ Table دروست بكات وەك ئەو وێنەوەی خوارەوە

```
C:\Windows\system32\cmd.exe
mysql> CREATE TABLE `city` (
    -> `id` INT NOT NULL AUTO_INCREMENT PRIMARY KEY ,
    -> `name` VARCHAR( 25 ) NOT NULL);
Query OK, 0 rows affected (0.01 sec)
```

ئێستا بۆ بینینی table فرمانی SHOW TABLES بنووسە و ئینتەر بكە.

```
mysql> SHOW TABLES;
+---------------------+
| Tables_in_kurdistan |
+---------------------+
| city                |
+---------------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك لە وێنەكەی سەرەوە دیارە TABLE بە ناوی city دروست بوە بۆ ڕاهاتن لەسەر فرمانەكە چەند داتابێزەك دروست بكە و چەند تەیبڵەك دروست بكەو تا تەواو ڕادێ لە بەكار هێنانی فرمانەكان.

## DROP TABLE -10

واتا سڕینەوەی table چۆنیەتی بەکار هێنانی ئاسانە تەنها ناوی table کە بنووسە و Enter وەك ئەو وێنەوی خوارەوە

```
C:\Windows\system32\cmd.exe
mysql> DROP TABLE city;
Query OK, 0 rows affected (0.01 sec)

mysql> SHOW TABLES;
Empty set (0.00 sec)
```

وەك لە وێنەکە دیارە فرمانی DROP TABLE پاشان ناوی تەیبڵەکە دەنوسی پاشان ; دەنووسی و Enter دەکەی ڕاستەوخۆ تەیبڵەکە دەسڕیتەوە

بۆ دڵنیا بون لە فرمانەکە دەتوانی فرمانی SHOW TABLES بەکار بینی بۆ بینینی تەیبڵەکان وەك لە وێنەکە دیارە.

بەڕیزان زمانی SQL زمانێکی زۆر ئاسانە وە نزیکترین زمانە لە زمانی مرۆڤ وەك دەبینن فرمانەکانی هەمووی واتای لەخۆتی وەك , DROP , CREATE , UPDATE , WHERE , LIKE ... هتد

بۆیە تەنها کەمێك خۆت ماندووکەی زۆر بە ئاسانی لێتێدەگەی دەتوانی بە ماوەیکی کەم فێری ببیی.

## ALTER TABLE , RENAME TABLE-11

واتا گۆڕینی ناوی تەیبل ئەویش لە ڕێگەی ئەو فرمانەی سەرەوە جێبەجێدەکری

RENAME TABLE \`ناوی تەیبڵ\` TO \` ناوی نوێ بۆ تەیبڵەکە\`

ئەگەر بمانەوێ ناوی تەیبڵەکە بگۆڕێن ئەوە فرمانەکە بەم شێوەیە جێبەجێدەکری

RENAME TABLE \`city\` TO \`shar\`;

بەو شێویە ناوی تەیڵەکە لە city دەگۆڕێن بۆ shar

تێبینی:-

لە دواتر باسی ALTER TABLE دەکەین بۆ زیاد کردنی COLUMN باسی گرینگی ئەو فرمانە دەکەین

```
mysql> SHOW TABLES;
+---------------------+
| Tables_in_kurdistan |
+---------------------+
| city                |
+---------------------+
1 row in set (0.00 sec)

mysql> RENAME TABLE `city` TO `shar`;
Query OK, 0 rows affected (0.01 sec)

mysql> SHOW TABLES;
+---------------------+
| Tables_in_kurdistan |
+---------------------+
| shar                |
+---------------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینن ناوی تەیبڵەگە گۆڕاوە لە city بۆ shar . وەك دەبینین لە ڕێگەی فرمانی پیشاندانی تەیبڵ دەبینیی ناوەکە گۆڕاوە

لێرەوە کۆتایی بە ناساندنی DDL دێنین وابزانم زۆر ئاسانە هیچ زەحمەت نیە بۆیە فرمانەکان دووبارە بکەوە تا تەواو ڕادێت لەسەر بەکار هێنانی چونکە لە داهاتوو دەچینە سەر بەشێکی زۆر گرنگ بۆ ئەوەی تەواو ئامادەبی دەبی بزانی ئەو فرمانانەی سەرەوە بە باشی جێبەجێ بکەی چونکە ئەو فرمانانی سەرەوە تەنها دەرگا دەکاتەوە بۆ ناو بابەتەکە.

## 12- ناساندنی DML

کورتکراوەی Data Manipulation Language واتا زمانی چارەسەرکردنی داتاکان

کە پێك دێت لە کۆمەڵێك فرمانی سەرەکی وەك ( INSERT ,WHERE,UPDATE,DELETE )

یەك لەدوای یەك شیدەکەینەوە و بەکاریان دینین.بەکورتی INSERT واتا داخل کردن WHERE واتا لە هەر شوێنێك بی ئەو فرمانە زیاتر لەگەڵ SELECT بەکار دێت بۆ دورستکردنی ڕستەیەکی تەواو . UPDATE بۆ نوێکردنەوەی زانیاری بەکار دێ.DELETE بۆ سڕینەوەی زانیاری بەکاردێت.

# INSERT -13

واتا داخل کردنی زانیاری بۆ ناو داتا بێز فرمانێکی زۆر گرنگە کە هەردەم ئیشی پێدەکەی. چۆنیەتی بەکار هێنانی بەو شێوەیە دەبێ

```
INSERT into table_name (column1, column2) values (value1, value2);
```

ئێمە داتابێزێك دروست دەکەین بۆ کۆمپانیایەك بە ناوی company چەند خاڵێکی گرنگ هەیە دەبێ ڕەچاوی بکەین بۆ بۆ دروستکردنی داتا بێزەکە وەك ژمارەی کارمەندان و تەمەنی کارمەند و موچەو ناونیشان و ئیمێڵ و ژمارەی مۆبایل ........هتد

با بە وێنە ڕوونی بکەینەوە

بەکوردی:-

| ژمارە | ناوی | ناوی دووەم | موچە | ناونیشان | ئیمێڵ | ژمارەی مۆبایل |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ramiar | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com | 123456789 |
| 2 | kamaran | Kamal | 300000 | karkuk | karzan@hotmail.com | 987456321 |
| 3 | Hogr | Miran | 150000 | Halabja | hogr@gmail.com | 321456789 |
| 4 | Kurdistan | Shuan | 200000 | duhok | kurdistan@hotmail.com | 258741369 |
| 5 | Sara | Sangar | 225000 | hawler | sara@yahoo.com | 785423654 |

داتابێزەکە بەو شێوەی دەبێ

| ID | F_NAME | L_NAME | SALARY | ADDRESS | EMAIL | MOBILE |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ramiar | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com | 123456789 |
| 2 | kamaran | Kamal | 300000 | karkuk | karzan@hotmail.com | 987456321 |
| 3 | Hogr | Miran | 150000 | Halabja | hogr@gmail.com | 321456789 |
| 4 | Kurdistan | Shuan | 200000 | duhok | kurdistan@hotmail.com | 258741369 |
| 5 | Sara | Sangar | 225000 | hawler | sara@yahoo.com | 785423654 |

ئێستا داتا بێزەك دروستکە بە ناوی company پاشان تەیبێلّك درووست بکە بە ناوی members یان هەر ناوێك گرنگ نیە پاشان ئەو زانیارانە داخل دەکەین لە ڕێگەی فرمانی INSERT

وەك ئەو خشتەی سەرەوە دتابێزەك دروستدەکەین کە ناوی کارمەند و مووچە و ژمارەی مۆبایل و شوێن و ...هتد یەکەم جار داتا بێز دروست کە پاشان برۆ سەر داتا بێزەکەی وەك لە خوارەوە ڕوونکراوەتەوە

```
mysql> CREATE DATABASE `company`;
Query OK, 1 row affected (0.01 sec)

mysql> USE `company`;
Database changed
```

پاشان تەیبڵەکە دروست کە وەك خشتەکە

```
mysql> CREATE TABLE `members` (
    -> `id` INT NOT NULL AUTO_INCREMENT PRIMARY KEY ,
    -> `f_name` VARCHAR( 200 ) NOT NULL ,
    -> `l_name` VARCHAR( 200 ) NOT NULL ,
    -> `salary` INT NOT NULL ,
    -> `address` VARCHAR( 220 ) NOT NULL ,
    -> `email` VARCHAR( 50 ) NOT NULL ,
    -> `mobile` INT NOT NULL );
Query OK, 0 rows affected (0.01 sec)
```

پاش نوسینی ( CREATE TABLE `members` ئینتەر بکە بۆ نوسینی فرمانەکانی تر چونکە هەموو لە یەك دێر جێی نابیتەوە

ئێستا خشتەکەمان درووست کرد بۆ بینینی دەتوانی ئەو فرمانە بنووسی ;desc members بۆ بینینی ئەنجامی کارەکە

وەك لە خوارەوە دەبینین خشتەکە درووست بووە .

```
mysql> desc members;
+---------+--------------+------+-----+---------+----------------+
| Field   | Type         | Null | Key | Default | Extra          |
+---------+--------------+------+-----+---------+----------------+
| id      | int(11)      | NO   | PRI | NULL    | auto_increment |
| f_name  | varchar(200) | NO   |     | NULL    |                |
| l_name  | varchar(200) | NO   |     | NULL    |                |
| salary  | int(11)      | NO   |     | NULL    |                |
| address | varchar(220) | NO   |     | NULL    |                |
| email   | varchar(50)  | NO   |     | NULL    |                |
| mobile  | int(11)      | NO   |     | NULL    |                |
+---------+--------------+------+-----+---------+----------------+
7 rows in set (0.01 sec)
```

هەتا ئێستا تەنها دروستکردنی تەیبڵە هێشتا زانیاریمان داخل نەکردیە با بێن زانیاری داخڵبکەین لە ڕێگەی فرمانی INSERT بە کارهێنانی زۆر ئاسانە .

```
mysql> INSERT INTO members (f_name, l_name, salary, address, email, mobile) VALUES
    -> ("ramiar","karwan",250000,"sulimani","hangaw@yahoo.com",123456789);
Query OK, 1 row affected (0.01 sec)
```

وەك لە سەرەوە دیارە فرمانەکە بنووسەوە پاشان ناوی خشتەکانی بدێ و پاشان زانیاریەکانی بنوسەوە .

تێبینی دەکەین کە id مان نەنوسیتەوە وەك لەسەرەوە باسم کرد لە لاپەڕە 16 لە ڕێگەی فرمانی AUTO_INCREMENT بەرنامەکە بە خۆی دەینوسی و ژمارەکان ڕیزبەند دەکات بۆیە پێویست ناکات بینوسینەوە وە ژمارەکان ناخرێتە نێوان کۆدەوە ( " " ) ژمارە وەك خۆی دەنوسرێتەوزە بەڵام ئەوانی تر دەخێرتە ناو دوو کۆدەوە .من یەك ناوم داخل کرد تۆ دەتوانی هەموو ناوەکان داخل بکەی یەك لە دوای یەك وەك لەسەرەوە ڕونکرایتەوە چەند زانیاریت دەوێ داخل بکە. بۆ بینینی زانیارەکان فرمانی SELECT * FROM members; بەکار بینە مانای ئەو فرمانە ( واتا هەرچی لە ناو تەیبڵی members هەیە پیشانبدە )

```
mysql> SELECT * FROM members;
+----+-----------+--------+--------+----------+-------------------------+-----------+
| id | f_name    | l_name | salary | address  | email                   | mobile    |
+----+-----------+--------+--------+----------+-------------------------+-----------+
|  1 | ramiar    | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com        | 123456789 |
|  2 | kamaran   | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com       | 987456321 |
|  3 | hogr      | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com          | 321456789 |
|  4 | kurdistan | shuan  | 200000 | duhok    | kurdistan@hotmail.com   |  25874369 |
|  5 | sara      | sangar | 225000 | hawler   | sara@yahoo.com          | 785423654 |
+----+-----------+--------+--------+----------+-------------------------+-----------+
5 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبیبنین زانیارەیکان داخل بوە هەر ناوە ژمارەیەکی وەرگرتەوە ریزبەنی ناوەکان و ناو یەکەم و ناوی دووەم و شوێن و مووچەو ناونیشان و ئیمێل و ژمارەی مۆبایل. هەموو ڕێك خراوە وەك خۆمان ویستمان ئەوها ڕێز بووە ئەوەیە چۆنیەتی بەکار هێنانی فرمانی INSERT چەند جارەك داتا بێز دروست کە و تەیبڵ دروستکە و زانیاری داخل بکە مەرج نیە وەك خشتەکەی بی تۆ بە کەیفی خۆت داتابێزەك دروستکە بەگوێرەی پێویستی خۆت وە زانیاری داخل بکە.

## 14- WHERE

فرمانێکی گرنگە واتا :- لە هەر شوێنەك بی یان لەکوێ یان بۆ دانانی مەرج (Conditions )
بەکارهێنانی زۆر ئاسانە و زۆریش گرنگە کە لە گەڵ فرمانەکانی تر لێك دەبەسترێتەوە بۆ ئەنجامدانی چەندین فرمانی گرنگ.

پێش ئەوەی باسی WHERE بکەین با باسی FROM بکەین واتە ( لە ) بۆ نمونە ئەگەر بمانەوێ زانیایەکان ببینین دەبی چی بکەین ؟؟

یەکەم فرمان بۆ بینینی هەموو زانیاریەکان

SELECT * FROM members;

SELECT واتا دیاری بکە یان پیشانی بدە

( * ) هێمای ئەستێرە واتا هەموو
FROM واتا لە
Members ناوی تەیبڵەکەیە

ڕستەکەی بەو شێوەیە دەخوێندرێتەوە ( هەرچی هەیە لە ناو تەیبڵی members پیشانی بدە )

ئەگەر ڕستەکە جێبەجێ بکەین بەو شێوەیە پیشانمان دەدات

```
mysql> SELECT * FROM members;
+----+-----------+--------+--------+----------+-----------------------+-----------+
| id | f_name    | l_name | salary | address  | email                 | mobile    |
+----+-----------+--------+--------+----------+-----------------------+-----------+
|  1 | ramiar    | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com      | 123456789 |
|  2 | kamaran   | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com     | 987456321 |
|  3 | hogr      | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com        | 321456789 |
|  4 | kurdistan | shuan  | 200000 | duhok    | kurdistan@hotmail.com |  25874369 |
|  5 | sara      | sangar | 225000 | hawler   | sara@yahoo.com        | 785423654 |
+----+-----------+--------+--------+----------+-----------------------+-----------+
5 rows in set (0.00 sec)
```

بەڵام ئەگەر بمانەوێ زانیاریەکی دیاری کراو وەرگرین واتا زانیاری یەك فەرمانبەر یان یەك ژمارە ؟؟

ئەوە لێرەوە دەبی پشت بە فرمانی WHERE ببەستین بۆ ئەو مەبەستە بەکار هێنانی زۆر ئاسانە تەنها ڕستەکە ڕێك بخەو تەواو

بۆ نمونە :- زانیاری فەرمانبەری ژمارە 4 م دەوێ ببینین ؟؟

SELECT * FROM members WHERE id =4;

```
mysql> SELECT * FROM members WHERE id =4;
+----+-----------+--------+--------+---------+------------------------+----------+
| id | f_name    | l_name | salary | address | email                  | mobile   |
+----+-----------+--------+--------+---------+------------------------+----------+
|  4 | kurdistan | shuan  | 200000 | duhok   | kurdistan@hotmail.com  | 25874369 |
+----+-----------+--------+--------+---------+------------------------+----------+
1 row in set (0.00 sec)
```

شیكردنەوی ڕستەكە

لە ناو تەیبڵی **members** بگەڕێ زانیاری ژمارە 4 بۆ پیشاندە.

وەك دەبینین تەنها زانیاری ژمارە 4 بۆ پیشاندراین

یان دەتوانین لە ڕێگەی ناوە بگەڕێن واتا ناوی فەرمانبەرەكە بنووسین یان لە ڕێگەی ژمارەی مۆبایل وە بگەڕێن.

بۆ نموونە لە ریگەی ژمارەی مۆبایل بگەڕین

**SELECT * FROM members WHERE mobile = 321456789;**

```
mysql> SELECT * FROM members WHERE mobile = 321456789;
+----+--------+--------+--------+---------+----------------+-----------+
| id | f_name | l_name | salary | address | email          | mobile    |
+----+--------+--------+--------+---------+----------------+-----------+
|  3 | hogr   | miran  | 150000 | halabja | hogr@gmail.com | 321456789 |
+----+--------+--------+--------+---------+----------------+-----------+
1 row in set (0.00 sec)
```

بە هەموو شێوەیەك ڕێك دەخرێ و دەبینی بێ كێشە. دەتوانی لە ڕێگەی ناو یەكەم و ناوی دووەم واتا **l_name , f_name** وەهەرەوەهااااااااااااااا لە بەشەكانی تر زیاتر ڕونی دەكەینەوە .

## 15- UPDATE

واتا نوێكردنەوە بۆ گۆڕینی زانیاری فەرمانبەرێك پێویستمان بەو فرمانە دەبێ بۆ ئەوەی زانیاریەكانی نوێبكەینەوە بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێ ژمارەی مۆبایل بگۆڕین یان مووچەی زیاد بكەین یان ناونیشانی بگۆڕین دەبێ لە ڕێگەی ئەو فرمانەوە بیگۆڕین.

چۆنیەتی بەكار هێنانی :-

```
UPDATE table_name SET
column_name1 = value1,
column_name2 = value2,
column_name3 = value3 ...
[WHERE conditions];
```

پێش هەموو شتێك با بێین زانیاری یەك فرمانبەر وەرگرین هەر بۆ تاقیکردنەوە:-

SELECT f_name, l_name, salary, address, email, mobile FROM members WHERE f_name=`sara';

واتای ئەو ڕستەیە :- ناوی یەکەم و ناوی دووەم و مووچەو و ناونیشان و ژمارەی مۆبایل و ئیمێڵی ئەو فەرمانبەرەم بۆ پیشاندە کە ناوی یەکەمی sara ە

```
mysql> SELECT f_name,l_name,salary,address,email,mobile FROM members WHERE f_name='sara';
+--------+--------+--------+---------+-----------------+-----------+
| f_name | l_name | salary | address | email           | mobile    |
+--------+--------+--------+---------+-----------------+-----------+
| sara   | sangar | 225000 | hawler  | sara@yahoo.com | 785423654 |
+--------+--------+--------+---------+-----------------+-----------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبیینین زانیاری تەواوی ئەو فەرمانبەری پیشاندا کە ناوی یەکەمی sara ە

ئێستا دەمانەوێ ژمارەی موچە و ئیمێڵی بگۆڕین بۆ ئەو مەبەستە فرمانی UPDATE بەکار دەینین

فرمانەکە بەو شێوەیە دەنوسرێتەوە

UPDATE members SET salary=75000, email='sara.sangar@yahoo.com' WHERE f_name=`sara';

شیکردنەوەی ڕستەکە:- واتا salary و email بگۆڕە بۆ ئەو ڕێژە نوێیەی کە نوسراوە پاشان مەرج بۆ ناوەکە کە دادەنێ کە ناوی sara واتا تەنها ئەوەی ناوی sara ە ئەو زانیاریانەی بگۆڕە.

ئێستا بێن تەماشای زانیارەکان کەین دەبینیی گۆڕاوە

ئەو ڕستەی سەرەوە جێبەجێ بکەوە تەماشای گۆڕانکاریەکان بکە.

```
mysql> SELECT f_name,l_name,salary,address,email,mobile FROM members WHERE f_name='sara';
+--------+--------+--------+---------+------------------------+-----------+
| f_name | l_name | salary | address | email                  | mobile    |
+--------+--------+--------+---------+------------------------+-----------+
| sara   | sangar |  75000 | hawler  | sara.sangar@yahoo.com | 785423654 |
+--------+--------+--------+---------+------------------------+-----------+
1 row in set (0.00 sec)
```

ئەگەر بەراوردی بکەین تێبینی ئەوەی دەکەین کە موچەکە لە 225000 گۆڕاوە بۆ 75000 وە ئیمێلەکەش بە هەمان شێوە گۆڕاوە

نمونەکی تر وەردەگرین :-

UPDATE members SET l_name = 'kardo', f_name = 'kurdo', address='kalar', salary=12000, email='kardo@mail.com'

WHERE id= 4;

ئەگەر تێبینی بکەی دەبینی لە کۆتایی مەرجەکەمان لە ڕێگەی ژمارە ڕیزبەندی داناوە واتا زانیاری ژمارە 4 بگۆڕە بۆ ئەو زانیاریانەی کە بۆی دیاری کراوە

```
/* زانیاریکان پێش گۆڕین */

mysql> SELECT f_name,l_name,salary,address,email,mobile FROM members WHERE id=4;
+-----------+--------+--------+---------+-----------------------+----------+
| f_name    | l_name | salary | address | email                 | mobile   |
+-----------+--------+--------+---------+-----------------------+----------+
| kurdistan | shuan  | 200000 | duhok   | kurdistan@hotmail.com | 25874369 |
+-----------+--------+--------+---------+-----------------------+----------+
1 row in set (0.00 sec)
/* فرمانی گۆڕینی زانیارەکان */
mysql> UPDATE members SET
    -> l_name = 'kardo',
    -> f_name = 'kurdo',
    -> address ='kalar',
    -> salary=12000,
    -> email='kardo@mail.com'
    -> WHERE id= 4;
Query OK, 1 row affected (0.01 sec)
Rows matched: 1  Changed: 1  Warnings: 0
/* زانیاریکان پاش گۆڕین */
mysql> SELECT f_name,l_name,salary,address,email,mobile FROM members WHERE id=4;
+--------+--------+--------+---------+----------------+----------+
| f_name | l_name | salary | address | email          | mobile   |
+--------+--------+--------+---------+----------------+----------+
| kurdo  | kardo  |  12000 | kalar   | kardo@mail.com | 25874369 |
+--------+--------+--------+---------+----------------+----------+
1 row in set (0.00 sec)
```

## DELETE -16

بۆ سڕینەوە بەکار دێ هەرچەندە باشترە زانیارەکان دەستکاری بکەی باشترە لە سڕینەوە بەڵام دەتوانی لە ڕێگەی ئەو فرمانە بە تەواوی بیسڕیەوە چۆنیەتی بە کار هێنانی

```
DELETE FROM `members` WHERE id  = 4;
```

شیکردنەوەی ئەو ڕستەیە :- واتا لە ناو تەیبڵی **members** ڕیزبەندی ژمارە **4** بسڕەوە

پێشئەوەی بیسڕینەوە با تەماشای بکەین

```
mysql> SELECT * FROM members;
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+
| id | f_name  | l_name | salary | address  | email             | mobile    |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+
|  1 | ramiar  | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com  | 123456789 |
|  2 | kamaran | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com | 987456321 |
|  3 | hogr    | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com    | 321456789 |
|  4 | kurdo   | kardo  |  12000 | kalar    | kardo@mail.com    |  25874369 |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+
4 rows in set (0.01 sec)
```

با فرمانەکە جێبەجێ بکەین و ببینین

```
mysql> DELETE FROM `members` WHERE id  = 4;
Query OK, 1 row affected (0.01 sec)

mysql> SELECT * FROM members;
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+
| id | f_name  | l_name | salary | address  | email             | mobile    |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+
|  1 | ramiar  | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com  | 123456789 |
|  2 | kamaran | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com | 987456321 |
|  3 | hogr    | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com    | 321456789 |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+
3 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دیبینین ڕیزبەندی ژمارە 4 سڕایتەوە وەك گوتم باشترە دەستکاری زانیاریەکان بکەی نەك بیسڕیەوە
چونکە زۆرکات لە کاتی سڕینەوە کێشەت بۆ دروستدەبی یان بیسڕیەوە دوای ناگەڕێتەوە

## 17- بەکارهێنانی LIMIT & ORDER BY , LIKE

هەر یەك بە جیا شی دەکەینەوە نموونەی لەسەر تاقی دەکەینەوە :-

A- LIKE لەناوەکەی دیارە واتا وەك بۆ گەڕان زیاتر بەکاری

نموونە :- لە ناو داتا بێزەکە بگەڕێ بە دوای ناوێك کە ناوی یەکەمی بە پیتی k دەست پێبکات

SELECT * FROM members WHERE f_name LIKE `k%`;

```
mysql> SELECT * FROM members WHERE f_name LIKE 'k%';
+----+---------+-------+--------+---------+-------------------+-----------+
| id | f_name  | l_name | salary | address | email             | mobile    |
+----+---------+-------+--------+---------+-------------------+-----------+
|  2 | kamaran | kamal | 300000 | karkuk  | karzan@hotail.com | 987456321 |
|  4 | kurdo   | kardo |  12000 | kalar   | kardo@mail.com    |  25874369 |
+----+---------+-------+--------+---------+-------------------+-----------+
2 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینی دوو ناوی پیشان دایە کە پیتی k دەست پێدەکات
تێبینی :- دەبی ئەو پیتەی یان ئەو ووشەی کە بەدوای دەگەڕێ لە لە نێوان دوو کۆد دایبنێ و لە
کۆتای هێمای لە سەدا دابنێ

نموونەکی تر

SELECT * FROM members WHERE address LIKE `s%`;

شیکردنەوەی ڕستەکە :- واتا یەکەم پیتی ئەدرێسەکەی بە پیتی s دەست پێبکات

```
mysql> SELECT * FROM members WHERE address LIKE 's%';
+----+--------+--------+--------+----------+------------------+-----------+
| id | f_name | l_name | salary | address  | email            | mobile    |
+----+--------+--------+--------+----------+------------------+-----------+
|  1 | ramiar | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com | 123456789 |
+----+--------+--------+--------+----------+------------------+-----------+
1 row in set (0.01 sec)
```

وەك دەبینین تەنها ئەك ناوی پیشاندا كە ئەدرێسەكەی بە پیتی s دەست پێدەكات
دەتوانی گەڕانەكە فراوانتر بكەی لە ڕێگەی دانانی دوو هێمای لە سەدا وەك

```
SELECT f_name, l_name, address, email FROM members WHERE
f_name LIKE `%a%`;
```

واتا لە ناوی یەكەم و ناوی دووەم و ناونیشان و ئیمێل بگەڕێ لە پیتی a

```
mysql> SELECT f_name, l_name, address, email FROM members WHERE f_name LIKE '%a%';
+---------+--------+----------+------------------+
| f_name  | l_name | address  | email            |
+---------+--------+----------+------------------+
| ramiar  | karwan | sulimani | hangaw@yahoo.com |
| kamaran | kamal  | karkuk   | karzan@hotail.com |
+---------+--------+----------+------------------+
2 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین دوو ناوی پیشان داین كە لە ناوی یەكەم و ناوی دووەم و ئیمێل و ناونیشان پیتی a هەیە.

یان دەتوانین هێمای یەكسانە ( = ) بەكار بینین واتا لەیەكچونی سەدا سەد

نموونە :- لە ناو داتا بێز بگەڕێن بەدوای ناوێك كە یەكسان بی بەو ناوەی دەمانەوێ یان ئەو ژمارەی كە دەمانەوێ

```
SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary = 12000;
```

واتا ناوی یەكەم و ناوی دووەمی ئەو فەرمانبەرە پیشاندە كە موچەكەی بریتیە لە 12000

```
mysql> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary = 12000;
+--------+--------+--------+
| f_name | l_name | salary |
+--------+--------+--------+
| kurdo  | kardo  |  12000 |
+--------+--------+--------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین تەنها ئەو فەرمانبەری پیشاندا كە مووچەكەی بریتیە لە 12000
وەهەروەها دەتوانین هێمای یەكسان نیە بەكار بینین ( != ) بۆ گەڕان

نموونە:-

```
SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary
!= 12000;
```

واتا ناوی ئەو فەرمانبەرەی كە مووچەی یەكسان نیە بە 12000

```
mysql> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary != 12000;
+---------+--------+--------+
| f_name  | l_name | salary |
+---------+--------+--------+
| ramiar  | karwan | 250000 |
| kamaran | kamal  | 300000 |
| hogr    | miran  | 150000 |
+---------+--------+--------+
3 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینی ناوی و موچەی 3 فەرمانبەری پیشانداوە كە زیاتر ە یان كەمترە گرنگ كە یەكسان نیە بەو ڕێژەی كە دیاریمانكردیە وەك مەرجی گەڕان كە بریتیە لە 12000

یان دەتوانین هێمای گەورەتر و بچوكتر بەكار بینین ( < > ) هێمای > واتا گەورەترە وە هێمای < واتا بچوكترە

نموونە :-

```
SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary < 300000 ;
```

واتا فەرمانبەرێك موچەكەی لە 300000 كەمتر بی

```
mysql> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary < 300000;
+--------+--------+--------+
| f_name | l_name | salary |
+--------+--------+--------+
| ramiar | karwan | 250000 |
| hogr   | miran  | 150000 |
| kurdo  | kardo  |  12000 |
+--------+--------+--------+
3 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین 3 فەرمانبەرەمان هەیە كە موچەیان لە 300000 كەمترە

نمونەكی تر:-

SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary > 150000;

واتا ئەو فەرمانبەرانەی كە موچەیان لە 150000 گەورەترە

```
mysql> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary > 150000;
+---------+--------+--------+
| f_name  | l_name | salary |
+---------+--------+--------+
| ramiar  | karwan | 250000 |
| kamaran | kamal  | 300000 |
+---------+--------+--------+
2 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین 2 فەرمانبەر هەیە كە مووچەیان لە 150000 زیاتر.

یان دەتوانین هێمای گەورەتر و یەكسانە بە كار بینین ( => وەك دانانی مەرج بۆ گەڕان

SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary >= 150000;

واتا مووچەی ئەو فرمانبەرانی كە گەورەترە و یەكسانە بە 150000

```
mysql> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary >= 150000;
+---------+--------+--------+
| f_name  | l_name | salary |
+---------+--------+--------+
| ramiar  | karwan | 250000 |
| kamaran | kamal  | 300000 |
| hogr    | miran  | 150000 |
+---------+--------+--------+
3 rows in set (0.00 sec)
```

یان بە پێچەوانەوە کە بچوکتر بی و یەکسان بی بە 150000

SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary <= 150000;

```
mysql> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary <= 150000;
+--------+--------+--------+
| f_name | l_name | salary |
+--------+--------+--------+
| hogr   | miran  | 150000 |
| kurdo  | kardo  |  12000 |
+--------+--------+--------+
2 rows in set (0.00 sec)
```

دەتوانی زیاتر لە مەرجێك بۆ گەڕان دابنێ لە ڕێگەی هێمای گەورەتر و بچوك تر و یەکسان و نا یەکسان بۆ زیاتر بچوکردنەوەی بازنەی گەڕان تا بەو زانیاریە بگەی کە دەتەوێ.

لە لاپەڕە 18 لە باسی ALTER TABLE , RENAME TABLE تەنها باسی RENAME TABLE مان کرد وەك تێبینی نووسیم لە دواتر باسی دەکەین بە باشم زانی ئێستا باسی بکەین بۆ زیاد کردنی COLUMN بۆ ئەوە هەڵبژاردنی زیاترمان بداتی لە کاتی جێبەجێکردنی فرمانەکان

بەڕیزان ئەو فرمانە زرۆ گرنگە کە بۆ زیاد کردنی COLUMN بکاردێت بۆ ئەوەی لە هەر کاتێك ئەگەر ویستت خانەیەك زیاد بکە کێشەت بۆ دروست نەکات بە ئاسانی زیادی بکە .

ئێمە خشتەکمان دروستکرد کە لەچەند خانەك پێکهات بوو وەك ناوی یەکەم و ناوی دووەم و مووچەو ناونیشان و ئیمێڵ و ژمارەی مۆبایل ئێمە ئەگەر بمانەوێ خانەکی دی زیاد بکەین پێویستمان بەو فرمانە دەبی بۆ نموونە خانەی تەمەن زیاد دەکەین بۆ خشتەکە واتا هەر فەرمانبەر و تەمەنەکانیان بۆ بنووسینەوە

ALTER TABLE members ADD COLUMN (age INT NOT NULL);

لە ڕیگەی ئەو فرمانەی سەرەوە دەتوانین خانەی تەمەن واتا age زیاد بکەین

```
mysql> ALTER TABLE members ADD COLUMN (age INT NOT NULL);
Query OK, 3 rows affected (0.04 sec)
Records: 3  Duplicates: 0  Warnings: 0

mysql> SELECT * FROM members;
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+-----+
| id | f_name  | l_name | salary | address  | email             | mobile    | age |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+-----+
|  1 | ramiar  | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com  | 123456789 |   0 |
|  2 | kamaran | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com | 987456321 |   0 |
|  3 | hogr    | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com    | 321456789 |   0 |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+-----+
3 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین لە كۆتایی خانەك زیاد بووە بە ناوی age بۆ دانانی تەمەن وەهەروەها لە ڕێگەی فرمانی UPDATE ژمارە بۆ خانەی تەمەن دابنێن وەك لە لەلاپەڕە 24 بەدرێژی باسی چۆنیەتی دەستكاری كردنی زانیاریەكانمان كردووە وەك بەبیرهێناوەیەك یەك ناوە وەردەگرین تەمەنی بۆ زیاد دەكەین

```
UPDATE members SET age = 30 WHERE id= 1;
```

واتا فەرمانبەری ژمارە 1 خانەی age بكە 30

```
mysql> UPDATE members SET age = 30 WHERE id= 1;
Query OK, 1 row affected (0.01 sec)
Rows matched: 1  Changed: 1  Warnings: 0

mysql> SELECT * FROM members;
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+-----+
| id | f_name  | l_name | salary | address  | email             | mobile    | age |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+-----+
|  1 | ramiar  | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com  | 123456789 |  30 |
|  2 | kamaran | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com | 987456321 |   0 |
|  3 | hogr    | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com    | 321456789 |   0 |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----------+-----+
3 rows in set (0.00 sec)
```

وەك لە سەرەوە دەبینی ژمارە بۆ خانەی تەمەن زیادكرا . وە هەروەها بۆ سڕینەوەی خانە دەتوانی بە هەمان فرمان بیسڕیەوە تەنها لە شوێنی ADD فرمانی DROP بنووسەوە .بۆ نموونە بمانەوێ خانەی مۆبایل دەسرینەوە

```
ALTER TABLE members DROP COLUMN mobile;
```

بۆ سڕینەوەی خانەی مۆبایل بەكارمان هێنا

```
mysql> ALTER TABLE members DROP COLUMN mobile;
Query OK, 4 rows affected (0.03 sec)
Records: 4  Duplicates: 0  Warnings: 0
mysql> SELECT * FROM members;
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----+
| id | f_name  | l_name | salary | address  | email             | age |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----+
|  1 | ramiar  | karwan | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com  |  30 |
|  2 | kamaran | kamal  | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com |  29 |
|  3 | hogr    | miran  | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com    |  25 |
|  5 | kojar   | karzan | 500000 | sulimani | uk@yahoo.com      |  22 |
+----+---------+--------+--------+----------+-------------------+-----+
4 rows in set (0.00 sec)
```

## بەكارهێنانی LIKE و ORDER BY و LIMIT

دێینەوە سەر باسی بەكارهێنانی LIMIT و ORDER BY و LIKE باسی چۆنیەتی بەكارهێنانی LIKE مان كرد ئێستا دێن باسی بەكارهێنانی ORDER BY دەكەین بزانین بۆچ مەبەستێك بەكاردێ

لەسەرەوە باسی چۆنیەتی پیشاندانی زانیاریمان كرد لە ڕێگە فرمانی WHERE كە لە ڕستەیەك داماندەنا بۆ پیشاندانی زانیاری لەگەڵ دانانی مەرج لەسەر چۆنیەتی گەڕان و پیشاندانی زانیاریەكان بەڵام ئەگەر بە شێوەكی وردتر بگەڕێن ئەوە پێوستمان بە فرمانی تر دەبێ بۆ گەیشتن بۆ زانیاریانەی كە دەمانەوێ بۆیە لێرەو گرنگی فرمانی ORDER BY دەردەكەوێ

ئەو فرمانە دەتوانی زانیاریەكانمان بۆ ڕێك بخات بە شێوەكی ڕێكوپێك ترتیبی بكات.

نموونە:- لە كاتی گەڕان بە دوای زانیاریەكان ئەوە هەڵدەستی بە پیشاندانی زانیارەكان بە شێوەی ترتیبی كات واتا ئەوەی یەكەم جار داخل كرایەوە ئەوەت پیشان دەدات دوای ئەوی تر ئەوی تر ...هتد بەڵام لەگەڵ بەكار هێنانی فرمانی ORDER BY جیاوازە دەتوانی مەرجی بۆ دابنێی بە و شێوەیەی تۆ دەتەوێ.

نموونە :-

SELECT f_name, l_name FROM members ORDER BY f_name ;

شیكردنەوەی فرمانەكە SELECT بەكار مان هێناوە لە پێشتر واتا پیشاندان یان خستە ڕوو l_name , f_name

واتا ناوی یەكەم و ناوی دووەم پیشاندە FROM واتا لە ناو members ناوی تەیبڵەكەیە

ORDER BY ئەو فرمانە تازیە هەڵدەستی بە خستنەڕووی زانیاریەكان لەسەربنچینەی ڕیزبەندی پیتی ئینگلیزی ڕیزی دەكات هەروەك لە كاتی جێبەجێكردنی فرمانەكە باشتر دەیبینین.

```
mysql> SELECT f_name, l_name FROM members ORDER BY f_name;
+---------+---------+
| f_name  | l_name  |
+---------+---------+
| hogr    | miran   |
| kamaran | kamal   |
| karmand | kawa    |
| kojar   | karzan  |
+---------+---------+
9 rows in set (0.01 sec)
```

وەك لە وێنەكە دیارە ناوی یەكەم و دووەم بەشێوەكی ڕێك ڕیزبەند كردووە بە گوێرەی ڕیزبەندی پیتەكانی زمانی ئینگلیزیواتا لە پیتی a دەستپێدەكات تا پیتی z نموونەكی تر وەرگرین

SELECT f_name, l_name FROM members ORDER BY l_name;

ئەو فرمانە تەنها یەك گۆڕانكاریمان تێداكرد ئەویش ڕیزكردنە بە گوێرەی ناوی دووەم واتا بە پێچەوانی ڕستەی یەكەم كە ناوی یەكەمان بە مەرج دانا

```
mysql> SELECT f_name, l_name FROM members ORDER BY l_name;
+--------+---------+
| f_name | l_name  |
+--------+---------+
| sara   | adam    |
| rzgar  | darbaz  |
| kamaran| kamal   |
| ramiar | karwan  |
| kojar  | karzan  |
| sami   | sarkawt |
| sarwan | serwan  |
+--------+---------+
9 rows in set (0.00 sec)
```

ئەگەر تێبینی بكەی ناوی دووەم ڕیزبەندی پیتی وەرگرتووە واتا ئەو ناوانەی كە بە پیتی a دەست پێدەكات دایناوە دواتر ئەوانەی بە پیتەكانی تر وەك ڕیزبەندی.

ئەگەر بمانەوێ بەگوێرەی تەمەن ڕیزبەندیان بكەین ئەوە چۆن دەبێ ؟؟ بەو شێوەیە ڕستەكە ڕێكدەخەین

**SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age;**

لەو ڕستەیە ناوی یەكەم و ناوی دووەم و تەمەن پیشن دەدات بەگوێرەی تەمەن واتا بچوكترین تەمەن دواتر گەورەتر و گەورەتر ..هتد

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age;
+---------+---------+-----+
| f_name  | l_name  | age |
+---------+---------+-----+
| karmand | kawa    |  18 |
| sara    | adam    |  19 |
| rzgar   | darbaz  |  21 |
| kojar   | karzan  |  22 |
| hogr    | miran   |  25 |
| kamaran | kamal   |  29 |
| sarwan  | serwan  |  29 |
| ramiar  | karwan  |  30 |
| sami    | sarkawt |  31 |
+---------+---------+-----+
9 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینە بچوکترین تەمەن دواتر گەورەتر. بەڵام ئەگەر بمانەوێ بە پێچەوانەوە ڕیزی بەکەین واتا گەورەترین تەمەن دواتر بچوکتر ئەوە دەبی لەگەڵ فرمانی ORDER BY فرمانی descending دابنێ واتا بەم شێوەی لێدێ

SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age DESC;

لە کۆتای فرمانی DESC دادەنێن واتا لە گەورە دەستپێبکات

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age DESC;
+---------+---------+-----+
| f_name  | l_name  | age |
+---------+---------+-----+
| sami    | sarkawt |  31 |
| ramiar  | karwan  |  30 |
| kamaran | kamal   |  29 |
| sarwan  | serwan  |  29 |
| hogr    | miran   |  25 |
| kojar   | karzan  |  22 |
| rzgar   | darbaz  |  21 |
| sara    | adam    |  19 |
| karmand | kawa    |  18 |
+---------+---------+-----+
9 rows in set (0.00 sec)
```

ئەگەر لەگەڵ فرمانەکەی پێشوتر بەراورد بکەین دەبینی جیاوازە لە پیشاندانی زانیارەکان . یەکەم لە بچوکترین تەمەن دەستی پێکرد بەڵام فرمانی دووەم کە DESC تێدا بەکارهێنا لە گەورەترین تەمەن دەست پێدەکات بۆ بچوکتر دەڕوا

وەهەروەها دەتوانی فرمانی DESC بەکار بینی بۆ ڕیزبەندی ناو جگە لە ژمارە واتا ناوەکان ڕیزبەند دەکات بە شێوەی ڕیزبەندی پیتی واتا بە پیتی Z دەست پێدەکات بۆ پیتی A

```
mysql> SELECT f_name, l_name FROM members ORDER BY f_name DESC;
+---------+---------+
| f_name  | l_name  |
+---------+---------+
| sarwan  | serwan  |
| sara    | adam    |
| kamaran | kamal   |
| hogr    | miran   |
+---------+---------+
9 rows in set (0.00 sec)
```

تێبینی:- شتێك ماوە باسی بکەین ئەویش ASC لەگەڵ ORDER BY دەتوانی بەکار بینی ئەویش بۆ ڕیزکرد لە بچوکەوە بۆ گەورە هەرچەندە بە شێوەیکی خۆکاری ORDER BY لە بچوکەوە دەست پێدەکات بەڵام دەتوانی ASC بەکار بینی

## بەکارهێنانی LIKE و ORDER BY و LIMIT

هەر یەك لە ORDER BY و LIKE لە سەرەوە باسمان کرد ئێستا دێن باسی LIMIT دەکەین بزانین بۆ چ مەبەستێك بەکار دێ

LIMIT وەك لە ناوەکەی دیارە واتا سنور یان دیاری کردنی سنور . واتا ئەگەر بمانەوێ ژمارەیکی سنوردار دیاری بکەین بۆ پیشاندانی.

نموونە:- ئەگەر بمانەوێ زانیاری ئەو فەرمانبەرانەوە ببینین کە لە ژمارە 1 دەست پێدەکات تا ژمارە 5 بۆئەو مەبەستە پشت بەو فرمانە دەبەستین

SELECT id, f_name, l_name, age FROM members LIMIT 5;

واتا لە ژمارە یەکەوە تا ژمارە 5 ژمارە و ناوی یەکەم و ناوی دووەم و تەمەنی پیشانبدە id زیادکراو تا ژماری ڕیزبەندی ببینی

```
mysql> SELECT id, f_name, l_name, Age FROM members LIMIT 5;
+----+---------+--------+-----+
| id | f_name  | l_name | Age |
+----+---------+--------+-----+
|  1 | ramiar  | karwan |  30 |
|  2 | kamaran | kamal  |  29 |
|  3 | hogr    | miran  |  25 |
|  4 | kojar   | karzan |  22 |
|  5 | rzgar   | darbaz |  21 |
+----+---------+--------+-----+
5 rows in set (0.00 sec)
```

تێبینی بکە تەنها 5 ناوی وەرگرتووە دەتوانی لە نێوان ژمارەکانش وەرگرین بۆ نموونە لە ژمارە 3 وە 3 فەرمانبەر وەرگرین

SELECT id, f_name, l_name FROM members LIMIT 3,3;

نوسیتمان لە ژمارە 3 دەست پێبکات واتا ژمارە سێ هەژمار ناکرێ بەڵکو لە ژمارە سێ دەست پێدەکات تا 3 فەرمانبەر لە خوارەوەی ژمارە 3 وەردەگری واتا 4 و 5 و 6 وەردەگری نەك ژمارە 3

```
mysql> SELECT id, f_name, l_name FROM members LIMIT 3,3;
+----+--------+--------+
| id | f_name | l_name |
+----+--------+--------+
|  4 | kojar  | karzan |
|  5 | rzgar  | darbaz |
|  6 | sarwan | serwan |
+----+--------+--------+
3 rows in set (0.00 sec)
```

ئەنجامی ڕستەکە بەو شێوەیە لێدێ کە لەسەرەوە دیارە لە ژمارە 3 دەست پێدەکات واتا 4 و 5 و 6 پیشاندایە

بەڕێزان فرمانی LIMIT ئەگەر لە گەڵ فرمانەکانی تر بەکار بینی زۆر کار ئاسانیمان بۆ دەکات بۆ نموونە لەگەڵ فرمانی ORDER BY بەکاریبینین

نمونەکی سادە وەرگرین

SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age LIMIT 4;

واتای ئەو ڕستەیە چیە ؟؟ واتا بچوکترین 4 فەرمانبەر پیشانبدە واتا لە ڕووی تەمەنەوە

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age LIMIT 4;
+---------+--------+-----+
| f_name  | l_name | age |
+---------+--------+-----+
| karmand | kawa   |  18 |
| sara    | adam   |  19 |
| rzgar   | darbaz |  21 |
| kojar   | karzan |  22 |
+---------+--------+-----+
4 rows in set (0.00 sec)
```

ئەنجامەکەی دیارە 4 لە بچوکترین فەرمانبەر لە ڕوی تەمەنەوە پیشاندرا ئەگەر تەماشای ڕستەکە بکەین تێبینی دەکەین تەمەن وەك مەرج داندراوە نمونەکی تر 5 لە گەورەترین تەمەن وەرگیرین

```
SELECT f_name, l_name, age FROM members ORDER BY age DESC LIMIT 5;
```

دەتوانی بەو شێوەیەی کە خۆت مەبەستە ڕستە ڕێك بخە بە بەکار هێنانی فرمانەکانی LIKE و ORDER BY و LIMIT تا بگەی بۆ زانیاریەی کە دەتەوێ لە داهاتوو زانیاری زیاتر دەخەنە سەر ئەو ڕستانەوە بۆ ئاسانکاری

زیاتر.

## 18- بەكارهێنانی Logical Operators ( or , and , not) هێما لۆجیكیەكان

بەكار هێنانی ئەو دەستە واژانە سوودێكی یەكجا زۆری هەیە وە زۆر ئاسان كاریمان بۆ دەكات بە كار هێنانیشیان زۆر ئاسانە تەنها لە ڕەستەدا بەكار بینە تەواو دەگەیەنە ئەو ئەنجامەی كە دەتوێ وەك لە ناوەكانیان دیارە not واتا نەخێر یان نەء یان تێدا نیە وە and واتا لەگەڵ وە or واتا یان هەر یەك واتاو بەكار هێنانی خۆی هەیە جیا لەوی تر. شتێك هەیە دەمەوێ ڕونی بكەمەوە لە نێوان and و or جیاوازی هەیە وات زۆر جیاوازن هەر چەندە لە واتا لێك نزیكن بەڵام لە ناوەڕۆك زۆر جیاوازن لە بەكار هێنانی and واتا لەگەڵ دەتوانی دوو مەرج دابنێی هەردوو مەرج دەبێ بێتە جێ ئەوكات ئیش دەكات و ئەنجامت دەداتێ بەڵام بە پێچەوانەوە or دوو مەرج دادەنێ دەبێ یەكێك لەو مەرجانە بێتەدی بەڵام گرنگ نیە هەدوو مەرج بێتە دی بەڵام گرنگە یەكێك لەومەرجانە دەبێ بێتەدی

با بە نموونە ڕونكەینەوە باشتر تێدەگەین:-

دەمانەوێ ناوی ئەو فەرمانبەری وەرگرین كە بە پیتی s دەستپێدەكات وە بەمەرجێك تەمەنی لە 30 ساڵ گەورەتربێ

SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE `s%` AND age > 30;

واتای ئەو ڕستەیە :- ناوی یەكەم و ناوی دووەم و تەمەنی كە ناوی یەكەم بە پیتی s دەست پێبكات و تەمەنی لە 30 ساڵ گەورەتربێ دەبێ هەردوو مەرج تێدابێ هەم تەمەنی لە 30 ساڵ گەورەتر بێ هەم پیتی یەكەمی بە پیتی s دەست پێبكات نابێ یەك مەرجی تێدابێ بەڵكو دەبێ هەردوو بەرجی تێدابێ ئەگەر نا ئەو ڕستەیە بێ ئەنجام دەبێ

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE 's%' AND age >30;
+--------+---------+-----+
| f_name | l_name  | age |
+--------+---------+-----+
| sami   | sarkawt |  31 |
+--------+---------+-----+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك تێبینی دەكەین یەك ناوی دیتەوە كە ئەو دوو مەرجەی تێدابێ

نموونە:- كە یەكێك لەو مەرجانی تێدا نەبێ

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE 's%' AND age >60;
Empty set (0.00 sec)
```

بێگومان هیچ نادۆزێتەوە چونكە بەرجی تەمەنی تێدا بەدی ناكرێ چونكە 60 داندراوە هیچ فەرمانبەرێك ئەو تەمەنەی نیە ئەگەر چی مەرجی یەكەمی تێدا بەدی دەكرێ بەڵام وەك گوتمان دەبێ هەردوو مەرجی تێدا بێئەو كات فرمانەكە ئیش دەكات. نمونەكی تر بۆ ئەوەی مەرجەكەمان ئاسان بێ زۆربەی فەرمانبەكان بگرێتەوە

```
SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE '%a%' AND age >1;
```

واتا ناوی یەكەم و ناوی دووەم و تەمنی ئەو فەرمانبەرانە پیشاندە كە پیتی a لە ناوەكانیاندا هەیە وە تەمەنیان لە 1 ساڵ گەورەترە بێگومان ئەو دوو مەرجە زۆربەی فەرمانبەران دەگرێتەوە چونكە هەم مەرجی تەمەن دیانگرێتەوە هەم مەرجی ناوەكەیانە كە پیتی a تێدابێ

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE '%a%' AND age >1;
+---------+---------+-----+
| f_name  | l_name  | age |
+---------+---------+-----+
| ramiar  | karwan  |  30 |
| kamaran | kamal   |  29 |
| kojar   | karzan  |  22 |
| rzgar   | darbaz  |  21 |
| sarwan  | serwan  |  29 |
| sami    | sarkawt |  31 |
| karmand | kawa    |  18 |
| sara    | adam    |  19 |
+---------+---------+-----+
8 rows in set (0.00 sec)
```

دیارە کە زۆربەی فەرمانبەرەکانی تێدایە کە ئەو دوو مەرجە دەیانگرێتەوە.

نموونەکی تر :-

SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE age > 20 AND age < 27;

واتا ناوی ئەو فرەمانبەرانەی کە تەمەنیان لە 20 ساڵ گەورە ترە وە لە 27 ساڵ بچوکترن

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE age > 20 AND age < 27;
+--------+--------+-----+
| f_name | l_name | age |
+--------+--------+-----+
| hogr   | miran  |  25 |
| kojar  | karzan |  22 |
| rzgar  | darbaz |  21 |
+--------+--------+-----+
3 rows in set (0.00 sec)
```

تەنها ئەوەی تەمەنی لە نیوان 20 تا 27 ساڵە پیشانی دا

تەنها ئەوەی گرنگە بیزانی لە بەکارهێنانی and ئەوەیە کە دەبێ هەردوو مەرج جێبەجێبێ ئەوکات فرمانەکە ئەنجامی دەبێ

## بەكار هێنانی OR

لەسەروە باسمانكرد بە مانای ( یان ) دێ واتا دوو مەرج دادەنی دەبێ یەكێك لەو مەرجانە جێبەجێ بێ بەڵام مەرج نیە هەردوو مەرج جێبەجێبێ تەنها یەكێك جێبەجێبێ ئەوە ڕستەكە ئیشدەكات

نموونە :-

SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE 'a%' OR age > 20;

واتا ناوی یەكەم و ناوی دووەم تەمەنی پیشاندە كاتێك ناوی یەكەم بە پیتی a دەست پێبكات یان تەمەنی لە 20 گەورەتربێ

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE f_name LIKE 'a%' OR age > 20;
+---------+---------+-----+
| f_name  | l_name  | age |
+---------+---------+-----+
| ramiar  | karwan  |  30 |
| kamaran | kamal   |  29 |
| hogr    | miran   |  25 |
| kojar   | karzan  |  22 |
| rzgar   | darbaz  |  21 |
| sarwan  | serwan  |  29 |
| sami    | sarkawt |  31 |
+---------+---------+-----+
7 rows in set (0.01 sec)
```

یەكەم مەرجی تێدا نیە واتا هیچ كەسێك لە ناو داتا بێزەكە بە پیتی a ناوەكەی دەست پێناكات بەڵام مەرجی دووەم دیگرێتەوە كە تەمەنیان لە 20 گەورە ترە. با نموونەكی تر وەرگرین هەندێك ئاڵۆزتربێ.

گەڕان بەدوای ناوی یەكەم و ناوی دووەم بە مەرجێك ناوی یەكەم و دووەم بە پیتی s دەست پێبكات یان پیتی k دەستپێبكات و تەمەنیان لە 25 گەورەتربێ .

لەوانەیە كەمێك زەحمەت بێ بەڵام لەگەڵ بەكارهێنانی هێماكان زۆر ئاسان دەبێ تەنها تۆزێك بیربكەوە دەتوانی بەئاسانی ڕێكی بخەی. ڕستەكە بەو شێوەیە دروستدەكری بە بەكارهێنانی select و where و and و هێمای گەورەتر > و هێمای لە سەدا % وە كۆتایی بە بەكارهێنانی or ڕستەكە بەوشێوەی خوارەوە ڕێك دەخەین

SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE (l_name LIKE 's%' OR 'k%') AND age > 25;

ئەوەی تازە بێ تەنها دوو كەوانەكەیە كە ئەویش بۆ ئەوەیە كە فرمانەكان تێكەڵ بە یەكتری نەبێ

```
mysql> SELECT f_name, l_name, age FROM members WHERE (l_name LIKE 's%' OR 'k%') AND age > 25;
+--------+---------+-----+
| f_name | l_name  | age |
+--------+---------+-----+
| sarwan | serwan  |  29 |
| sami   | sarkawt |  31 |
+--------+---------+-----+
2 rows in set, 1 warning (0.00 sec)
```

وەك دەبینینی تەنها دوو ناوی تێدایە كە ئەو مەرجانە بیگرێتەوە كە تەمەنیان لە 25 گەورەترە و ناوەكانیان بە پیتی s و k دەستپێبكات.وابزانم بەكارهێنانی OR زحمەت نیە تەنها دانانی لە ڕستە و لەگەڵ دانانی مەرجی پێویست .

ئەوەی تا ئێستا باسمان كرد ئەوە OR بوو بەڵام XOR هەیە بزانین ئەوە چ جیاوازیەكی هەیە لەگەڵ OR

لە OR دەبی یەكێك لە مەرجەكانی تێدابی یان هەردوو مەرجی تێدابی

بەڵام لە XOR ئەگەر هاتوو هەردوو مەرجی تێدابی ئەوە یەكساندەبی بە 0 وە ئەگەر یەك مەرجی تێدابی ئەوە ئەنجامی دەبی

واتا مەرجی یەكەم و مەرجی دووەمی تێدابی = 0

وەگەر یەك مەرجی تێدابی ئەوە یەكسانە بە 1

بە كورتی :- لە OR هەردوو مەرج وەردەگری یان یەك مەرج بەڵام لە XOR نابی هەردوو مەرجی تێدابی

نموونەی:- SELECT * FROM members WHERE id = 2 XOR f_name = 'kamaran';

واتا ژماری ڕیزبەندی كە id یەكسان بی بە 2 و یان ناوی یەكەمی یەكسان بی بە kamaran

ئێستا ئەگەر جێبەجێبكین بزانین چ پیشاندەدا

```
mysql> SELECT * FROM members WHERE id = 2 XOR f_name = 'kamaran';
Empty set (0.00 sec)
```

هیچ نەدۆزرایەوە بۆ ؟؟ چونكە هەردوو مەرجی تێدابوو وەك گوتمان نابی هەردوو مەرجی تێدابی

```
mysql> SELECT * FROM members;
+----+----------+---------+--------+----------+--------------------+-----+
| id | f_name   | l_name  | salary | address  | email              | age |
+----+----------+---------+--------+----------+--------------------+-----+
|  1 | ramiar   | karwan  | 250000 | sulimani | hangaw@yahoo.com   |  30 |
|  2 | kamaran  | kamal   | 300000 | karkuk   | karzan@hotail.com  |  29 |
|  3 | hogr     | miran   | 150000 | halabja  | hogr@gmail.com     |  25 |
|  4 | kojar    | karzan  | 500000 | sulimani | uk@yahoo.com       |  22 |
|  5 | rzgar    | darbaz  | 600000 | hawler   | rzgar@yahoo.com    |  21 |
|  6 | sarwan   | serwan  | 900000 | duhok    | sarwan@yahoo.com   |  29 |
|  7 | sami     | sarkawt | 450000 | kalar    | sami@yahoo.com     |  31 |
+----+----------+---------+--------+----------+--------------------+-----+
```

تەماشای ڕیزبەندی دووەم بكە ناوی kamaran هەیە كە ژمارەی ڕیزبەندیەكەی یەكسانە بە 2 ئێمە گوتمان لە XOR نابی هەردوو مەرجی تێدابی ئەگەر هەردوو مەرجی تێدابی ئەوە یەكسان دەبی بە 0 واتا یان ناوی kamaran بی یان ژمارەی ڕیزبەندی 2 بی كەچی هەردوو مەرجی تێدا بەدی دەكری بۆیە یەكسان دەبی بە 0 بەڵام ئەگەر مەرجی یەكەم و دووەم جیاواز بوون ئەوە ئەنجامی جیاوازی دەبی

نموونە :- SELECT * FROM members WHERE id = 3 XOR f_name = 'kamaran';

واتا یان ژمارەی ڕیزبەندی یەکسان بی بە 3 ئەگەر نا ناوی یەکەمی یەکسانبی بە kamaran

```
mysql> SELECT * FROM members WHERE id = 3 XOR f_name = 'kamaran';
+----+----------+-------+--------+---------+---------------------+-----+
| id | f_name   | l_name| salary | address | email               | age |
+----+----------+-------+--------+---------+---------------------+-----+
|  2 | kamaran  | kamal | 300000 | karkuk  | karzan@hotail.com   |  29 |
|  3 | hogr     | miran | 150000 | halabja | hogr@gmail.com      |  25 |
+----+----------+-------+--------+---------+---------------------+-----+
2 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینیی یەك مەرجی تێدایە کە ناوی kamaran بەڵام ژمارەی ڕیزبەندەی جیاوازە بە یەکسان نیە بە 3 بۆیە دوو ئەنجامی هەبوو یەکێکیان ناوەکەیە ئەوی تریان ژمارەی ڕیزبەندیە

ڕونکردنەوە بە وێنە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە جیاوازی نێوان OR و XOR

لە کاتی یەکسان بوون بە 0 واتا هەردوو مەرجی تێدابێ




هەردوو مەرجی تێدابێ یەکسان دەبێ بە 0

بەڵام لە کاتێك کە یەك مەرجی تێدابێ




مەرجی یەکەمی تێدابێ یان مەرجی دووەمی تێدابێ نابێ هەردوو مەرجی تێدابێ ئەوکات یەکساندەبێ بە 1

بەڕێزان ئەوەی لە سەرەوە باسکرا ئەوە کورتەی بەکار هێنانی OR و XOR بووە

## 26- بەکار هێنانی NOT

ووشەیەکی نەرێیە لێرەدا بە واتای ( تێدا نەبێ ) دێ واتا تۆ کە لە ناو داتا بێز بەدوای زانیاریەك دەگەڕێ دەتوانی مەرجی بۆ دابنێ کە ئەو ناوەی تێدا نەبێ یان ئەو ژمارەیەی تێدا نەبێ یان ئەو زیانیاریەی کە خۆت بۆی دادەنێ تێدانەبێ ئەو فرمانە زیاتر لەگەڵ فرمانەکانی تر بەکار دێ بە نموونە باشتر ڕووندەکەینەوە.

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, l_name FROM members WHERE f_name NOT LIKE 'k%';
+---------+--------+
| f_name  | l_name |
+---------+--------+
| ramiar  | karwan |
| hogr    | miran  |
| sara    | sangar |
| sarbast | salm   |
| ali     | karem  |
| sangar  | salam  |
| ali     | karem  |
| arsalan | sadq   |
| sazgar  | qadr   |
| hawkar  | karm   |
| sarbaz  | salar  |
+---------+--------+
11 rows in set (0.00 sec)
```

شیکردنەوە ئەو فرمانەی سەرەوە :- واتا لە ناو زانیارەکان بگەڕێ ناوی یەکەم و ناوی دووەم بۆ دەسنیشان کە بە مەرجێك ناوی یەکەم بە پیتی ( K ) دەست پێنەکات وەك دەبینین لەسەرەوە هەموو ناوەنای پیشاندایە جگە لەو ناوەانە کە پیتی K دەست پێدەکەن .

وەك تاقی کردنەوە تۆ ئەو فرمانە جێبەجێبکە بزانە ئەنجامی چ دەبێ ؟

SELECT salary, address FROM members WHERE address NOT LIKE 'h%';

واتا موچەو ناونیشانی ئەوکەسانەم بۆ پیشاندە کە ناونیشانەکانیان بە پیتی H دەست پێنەکات

## 19- بەکار هێنانی Between , In

یەکەم IN واتا تێدابێ :- بۆ نموونە

SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE f_name IN ('sara' , 'hawkar');

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE f_name IN ('sara'
, 'hawkar');
+--------+--------+--------+
| f_name | l_name | salary |
+--------+--------+--------+
| sara   | sangar | 225000 |
| hawkar | karm   |  45000 |
+--------+--------+--------+
2 rows in set (0.00 sec)
```

واتا ناوی یەکەم و ناوی دووەم و مووچەی ئەندامەکان پیشانبدە کە ناوی یەکەمی sara و hawker تێدایە. بەکارهێنانی IN زۆر لە بەکارهێنانی OR ئاسانتر و بەسوود ترە وە هەروەها دەتوانی لەگەڵ NOT بەکاری بینی وەك ئەو نموونەی خوارەوە

SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE f_name NOT IN ('sara' , 'hawkar');

واتا ناوی یەکەم و ناوی دووەم و مووچەی ئەندامەکان پیشانبدە جگە لە ناوی sara و hawker

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE f_name NOT IN
('sara' , 'hawkar');
+-----------+--------+--------+
| f_name    | l_name | salary |
+-----------+--------+--------+
| ramiar    | karwan | 250000 |
| kamaran   | kamal  | 300000 |
| hogr      | miran  | 150000 |
| kurdistan | shuan  | 200000 |
| sarbast   | salm   |  23000 |
| ali       | karem  |  21299 |
| arsalan   | sadq   |  25000 |
| sazgar    | qadr   |  22399 |
| sarbaz    | salar  |  45555 |
+-----------+--------+--------+
9 rows in set (0.00 sec)
```

بۆنموونە:- ناوی ئەو فەرمانبەرانەم پیشان بدە كە مووچەكەیان لە نێوان 150000 بۆ 250000 ە

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary BETWEEN 150000 AND 250000;
+-----------+--------+--------+
| f_name    | l_name | salary |
+-----------+--------+--------+
| ramiar    | karwan | 250000 |
| hogr      | miran  | 150000 |
| kurdistan | shuan  | 200000 |
| sara      | sangar | 225000 |
+-----------+--------+--------+
4 rows in set (0.00 sec)
```

ئەنجامی ئەو فرمانەی سەرەو وەك دیارە 4 فەرمانبەر مووچەكانیان لە نێوان 150000 و 250000 ە

یان دەتوانین NOT لەگەڵ بەكاربینی هەمان فرمانی سەرەوە تەنها NOT بۆ زیاد بكە پێچەوانە دەبێتەوە واتا پیشاندانی مووچەی هەموو فەرمانبەرەكان تەها ئەوەن نەبێ كە مووچەیان لە نێوان 225000 و 250000 ە

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, l_name, salary FROM members WHERE salary  NOT BETWEEN 225000 AND 250000;
+-----------+--------+--------+
| f_name    | l_name | salary |
+-----------+--------+--------+
| kamaran   | kamal  | 300000 |
| hogr      | miran  | 150000 |
| kurdistan | shuan  | 200000 |
| sarbast   | salm   |  23000 |
| ali       | karem  |  21299 |
| sangar    | salam  |  23000 |
| ali       | karem  |  21299 |
| arsalan   | sadq   |  25000 |
| sazgar    | qadr   |  22399 |
| hawkar    | karm   |  45000 |
| sarbaz    | salar  |  45555 |
+-----------+--------+--------+
11 rows in set (0.00 sec)
```

## Aggregate Functions count() , sum() , min() , max() -20

```
MySQL provides 5 aggregate functions. They are:
1). MIN($column_name): Minimum value
2). MAX($column_name): Maximum value
3). SUM($column_name): The sum of values
4). AVG($column_name): The average values
5). COUNT(): Counts the number of entries.
```

بریتین لە كۆمەڵێك فەنكێشن بۆ زیاتر كار ئاسانی و گەیشتن بە زانیاری ورد و دروست بە كاتێكی كەم بۆ نمونە دەتوانی لە ڕێگەی فرمانی MAX() تەنها لە ناو ستونی مووچە بگەڕێ بۆ زۆرترین مووچە لە بری ئەوە لە ناو هەموو خشتەكە بگەڕێ.یان لە ڕێگەی فرمانی MIN() بە دوای كەمترین مووچە بگەڕێ. وە هەروەها فرمانی SUM() هەڵدەستێ بە كۆكردنەوەی كۆمەڵێك ڕاژە وەهەروەها AVG() هەڵدەستێ بە دۆزینەوەی ناوەندەریژە وە COUNT() هەڵدەستێ بە ژماردنی كۆمەڵێك لە ڕاژە لە ناو یەك ستوندا. بەم شێوەیە ئەو كۆمەڵە فرمانە كار دەكەن لە ئەنجامی تاقی كردنەوەكان زیاتر ڕوندەبێتەوە و زیاتر لێتێدەگەین

### یەكەم :- min()

نموونە گەڕان بە دوای كەمترین مووچە و پیشاندانی ناوەكەی

SELECT f_name, MIN(salary) FROM members;

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, MIN(salary) FROM members;
+--------+-------------+
| f_name | MIN(salary) |
+--------+-------------+
| ramiar |       21299 |
+--------+-------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین ناوی ئەو فەرمانبەری پیشاندا كە خاوەنی كەمترین مووچەیە

نموونە لەسەر MAX ()

گەڕان بە دوای ئەو فەرمانبەری كە خاوەنی زۆرترین مووچەیە

SELECT f_name, MAX(salary) FROM members;

```
MariaDB [company]> SELECT f_name, MAX(salary) FROM members;
+--------+-------------+
| f_name | MAX(salary) |
+--------+-------------+
| ramiar |      300000 |
+--------+-------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

## SUM() , AVG() فرمانی

هەردوو فرمانەکە جیاوازن وەك لەسەرەوە باسم کرد فرمانی sum() هەڵدەستێ بە کۆکردنەوەی ڕێژەی ناو یەك ستوون بەڵام avg() هەڵدەستێ بە ژماردنی ڕێژەی ناوەندی یەك ستون. با نموونە بۆ هەر یەك بهێنینەوە بۆ زیاتر تێگەیشتن.

یەکەم :- SUM()

SELECT SUM(salary) FROM members;

واتا کۆکردنەوەی هەموو ژمارەکانی ناو ستونی salary

```
MariaDB [company]> SELECT SUM(salary) FROM members;
+-------------+
| SUM(salary) |
+-------------+
|     1351552 |
+-------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین ئەنجامی کۆکردنەوەی هەموو ژمارەکانی ستونی salary

```
MariaDB [company]> SELECT salary FROM members;
+--------+
| salary |
+--------+
| 250000 |
| 300000 |
| 150000 |
| 200000 |
| 225000 |
|  23000 |
|  21299 |
|  23000 |
|  21299 |
|  25000 |
|  22399 |
|  45000 |
|  45555 |
+--------+
13 rows in set (0.00 sec)
```

ئەگەر بێت و هەموو ژمارەکان کۆبکەینەوە دەکاتە 1351552

دووەم فرمانی AVG()

نموونە :-

SELECT AVG(salary) FROM members;

واتا دۆزینەوەی ڕێژەی ناوەندی ژمارەکانی ناو ستونی salary

```
MariaDB [company]> SELECT avg(salary) FROM members;
+-------------+
| avg(salary) |
+-------------+
| 103965.5385 |
+-------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

ئەگەر بێن هەموو ژمارەکانی ستونی salary کۆ بکەینەوە کە 13 ژمارەن کە دەکاتە 1351552 دابەشی 13 دەکاتە 103965.5385 ئەوە پێدەگوترێ ڕێژەی ناوەندی واتا معدل.

وە دەتوانی زیاتر قوڵببیەوە تێدا و فرمانەکان لەگەڵ یەکتر بەکار بێنی تا دەگەیە ئەنجامی تەواو و ویستراو.

یەك شت ماوە باسی بکەم لێرە ئەویش فرمانی as کە بە مانای (وەك) دێت بۆ نموونە تۆ دەتەوێ کۆی گشتی مووچەکان بزانی ناوی بنێ کۆی گشتی بەڵام بە شێوەکی کاتی بەبێ ئەوەی ناوی ستوونەکە بگۆڕی

نموونە:- SELECT SUM(salary) AS "koe gshty" FROM members;

واتا کۆی گشتی هەموو مووچەکان بژمێرە کە لە ستونی salary هەیە وە بە شێوەکی کاتی ناوی بنێ koe gshty

```
MariaDB [company]> SELECT SUM(salary) AS "koe gshty" FROM members;
+-----------+
| koe gshty |
+-----------+
|   3804656 |
+-----------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبیینن بە شێوەکی کاتی ناوی ستونەکەی گۆڕی بۆ koe gshty .من بە کورتی باسم کرد دەتوانی بە چەندین شێوە بەکاری بێنی و سوودی لێوەرگری.

## سێهەم COUNT()

ئەو فرمانە چەند كارێك دەكات یەكێك لەو كردارانە بریتیە لە ژماردنی زانیاری داخل كراو لە ناو خشتە و پیشاندانی. بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێ بزانین چەند زانیاری لەناو خشتەی members هەیە ئەوا بەو شێوەیە جێبەجێ دەكەین

SELECT COUNT(*) FROM members;

```
MariaDB [company]> SELECT COUNT(*) FROM members;
+----------+
| COUNT(*) |
+----------+
|       38 |
+----------+
1 row in set, 3 warnings (0.03 sec)
```

واتا لە ناو هەموو خشتەی members تەنها 38 ڕیز زانیاری داخل كراوە

نمونەكی تر لە بە كار هێنانی count() ئەگە ربمانەوێ بزانین چەن فەرمانبەر خەڵكی كەركوكە ؟؟

```
SELECT count(*) as "danshtuy karkuk" FROM members WHERE address = 'karkuk';
```

```
 [company]> SELECT count(*) as "danshtuy karkuk" FROM members WHERE address = 'karkuk';
+-----------------+
| danshtuy karkuk |
+-----------------+
|               3 |
+-----------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین تەنها 3 کەس لە ناو خشتەکە خەڵکی کەرکوك ە . یان دەتوانین لەگەڵ GROUP BY بەکار بێنین بۆ ئەوەی زیانیاری وردتر بەدەست بێنین بۆ نموونە بمانەوێ بزانین فەرمانبەرەکان خەڵکی چەند شاری تێدایە و وە هەر شارێك چەند فرمانبەر لە خۆ دەگری. بەم شێوەیە دەنوسرێ

```
SELECT address, count(*) FROM members GROUP BY address;
```

```
[company]> SELECT address, count(*) FROM members GROUP BY address;
+-----------+----------+
| address   | count(*) |
+-----------+----------+
| amedi     |        3 |
| azadi     |        3 |
| chamchamal|        3 |
| duhok     |        3 |
| halabja   |        3 |
| hawler    |        3 |
| kalar     |        3 |
| karkuk    |        3 |
| lailan    |        3 |
| rzgare    |        3 |
| shorsh    |        3 |
| sulaimani |        2 |
| zakho     |        3 |
+-----------+----------+
13 rows in set (0.00 sec)
```

وەك دەبینین بە شێوەکی دروست خشتەکەی پیشانداوە شارەکانی نوسیوە لە بەرامبەری ژمارەکەی داناوە.

وە هەروەها دەتوانی بە چەندین شێوەی تر بەکاری بێنی. ئەوەیان بۆ تۆ بەجی دێڵم ........

## 21 – چەند تایبەتمەندیەك لە بەكارهێنی SELECT

لە نموونەكانی سەرەوە بینیمان فرمانی select چۆن لەگەڵ هەموو فرمانەكانی تر بەكار دێت و بە واتای پیشاندان دێت یان دەستنیشانكردن بەڵام دەتوانی بۆ چەندین مەبەستی تر بەكاری بینی وەك فرمانی echo , print لە زمانەكانی تر كە بەكار دێت دەتوانی هەمان شت بە فرمانی select بكە وە دەتوانی هاوكێشەی بیركاری پێ دروست بكەی وەك جاران و دابەش كردن و كۆكرنەوە ...هتد وە چەندین فرمانی تر كە لە خوارەوە بە نموونە باسی دەیەن

بۆ زانینی فێرژنی MySQL

SELECT VERSION();

```
MariaDB [company]> SELECT VERSION();
+----------------+
| VERSION()      |
+----------------+
| 10.1.9-MariaDB |
+----------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

یان بۆ زانینی كات و بەرواری ئێستا SELECT NOW();

```
MariaDB [company]> SELECT NOW();
+---------------------+
| NOW()               |
+---------------------+
| 2016-01-08 21:46:14 |
+---------------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

یان بۆ كرادرای Print SELECT 'i love kurdistan';

```
MariaDB [company]> SELECT 'i love kurdistan';
+------------------+
| i love kurdistan |
+------------------+
| i love kurdistan |
+------------------+
1 row in set (0.00 sec)
```

یان بەكار هێنانی وەك بژمێر واتا ئەنجامدانی كۆ و كەم و جاران و دابەش كردن

```
MariaDB [company]> SELECT 5*5;
+-----+
| 5*5 |
+-----+
|  25 |
+-----+
1 row in set (0.00 sec)

MariaDB [company]> SELECT 5+15;
+------+
| 5+15 |
+------+
|   20 |
+------+
1 row in set (0.00 sec)

MariaDB [company]> SELECT 15-5;
+------+
| 15-5 |
+------+
|   10 |
+------+
1 row in set (0.00 sec)

MariaDB [company]> SELECT 15/5;
+--------+
| 15/5   |
+--------+
| 3.0000 |
+--------+
1 row in set (0.00 sec)
```

ئەو نموونانەی سەرەوە گرنگترین بەكارهێنانەكانی فرمانی SELECT بوو.

## 22 – كۆتای و دوا ووتە

لە كۆتایی دا دەمەوێ ئەوە بڵێم MySQL تەنها ئەوەندە نیە كە من باسم كردیە بەڵكو ئەوە تەنها سەرەتایەكە بۆ ئاشنا بوون بە MySQL و چۆنیەتی كارپێكردنی. ئەو چەند لاپەڕی بەردەستان لە ساڵی 2014 دەستم كرد بە نووسینی بە تەمای ئەوەی بووم بە تێرو تەسەلی باسی بكەم بەڵام دەرفەت نەبوو تەواوی بكەم بۆیە هەوڵمدا هیچ نەبێ بەكورتی شتێكی لێ باس بكەم.هەورووەها من بە كورتی شیكردنەوەم بۆ كردیە بێ ئەوەی درێژەی بدەمێ وە داوی لێبوردن دەكەم ئەگەر هەر هەڵەیكم هەبێ.

AnGrY BoY

E-Mail: h4kurd@yahoo.com

----------------------------

www.h4kurd.com

```
mysql> SELECT NOW();
+--------------------+
|     2016-01-08     |
+--------------------+
```